# ئەندرۆید ستۆدیۆ



# Android Studio

- دابەزاندنی Java
- ناساندنی Java و چاککردنی هەڵەکان
- دابەزاندنی بەرنامەی ئەندرۆید ستۆدیۆ
- دابەزاندنی SDK Manager
- دروستکردنی ئامێری خەیاڵی (Android Emulators)
- چارەسەری هەڵەی HAXM installation error
- چارەسەری هەڵەی
Enable Virtualization Technology VTx
- پێکهاتەی بەرنامەی ئەندرۆید
- پێکهاتەی .APP
- Activity چییە ؟

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف

# دابەزاندنی  بەرنامەی ئەندرۆید ستۆدیۆ

**سەرەتا دەبێت جاڤا دابەزێنین بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەمان  ئەمەش لە سایتی ئۆراکڵدا هەیە**

http://www.oracle.com/technetwork/java/javase/downloads/index-jsp-138363.html

**www.oracle.com**

**یان لە سایتی گۆگڵدا بنوسە::**

**Java oracle download**






سەرەتا کلیك لێرە بکە







دواتر هەنگاوەکان جێبەجێبکە هەتا کۆتایی دادەبەزێت

دواتر بۆ ئەوەی بزانیت کە جافاکەت دابەزیوە پێویستە cmdبکەیتەوە
لە Run دا بنوسە cmd




Command Prompt

```
C:\Users\Sima>java -version
java version "1.8.0_131"
Java(TM) SE Runtime Environment (build 1.8.0_131-b11)
Java HotSpot(TM) Client VM (build 25.131-b11, mixed mode)

C:\Users\Sima>
```

دوای کردنەوەی Cmd بنوسە **java –version** و Enterبکە
دەبینیت جافاکە دابەزیوە

Command Prompt

```
C:\Users\Sima>javac
'javac' is not recognized as an internal or external command,
operable program or batch file.

C:\Users\Sima>
```

دوای دابەزاندنی جافا لەسەر کۆمپیوتەرەکەت دەنوسین **Javac**دەبینین نەناسێنراوە هەربۆیە دەبێت ئەم هەنگاوانەی خوارەوە ئەنجام بدەین بۆ ئەوەی جافا بناسێنرێت و بتوانیت بەباشی بەرنامەی ئەندرۆید ستۆید ئیش پێبکەین

# هەنگاوەکان بۆ ناساندنی جافا




بچۆرە سەر My computerو کلیکی لای راست بکە Properties هەڵبژێرە ئەم خشتەیە دەکرێتەوە




دواتر کلیك لەم بەشە بکە






دواتر كليك له Path بكه و

دواتر كليك له ئايكۆنی له edit

بكه و

خشته‌یه‌كت

بۆ ده‌كرێته‌وه

پاشان بچۆرە درایفی C:

دواتر فۆڵدەری Program File بکەرەوە و بچۆرە ناو فۆڵدەری **Java**

دواتر دەبینیت دوو فۆڵدەرت هەیە وەکو ئەوەی خوارەوە




هەر فۆڵدەرە بە جیا بیکەرەوە و بچۆرە ناو فۆڵدەری **bin** ەوە و لینکەکەیان کۆپی بکە و لە خشتەکەی پێشوتردا دایبنێ




لینکەکە کە کۆپیتکرد لەم خانەیەدا دایبنێ دواتر باسی دەکەین چۆن دایبنێیت






لینکی ناو ئەم خانەیە بەم ئێوەیە نوسراوە :

C:\ProgramData\Oracle\Java\javapath;%SystemRoot%\system32;%SystemRoot%;%SystemRoot%\System32\Wbem;%SYSTEMROOT%\System32\WindowsPowerShell\v1.0\;c:\Program Files\Microsoft SQL Server\100\Tools\Binn\;c:\Program Files\Microsoft SQL Server\100\DTS\Binn\;C:\Program Files\QuickTime\QTSystem\

تۆ دەبێت دوای ئەم لینکە ; واتە دەبێت semicolon دابنێیت و ئەو لینکەی لە فۆڵدەری bin لەناو فۆڵدەری java وەکە کۆپیتکردووە دەبێت لێرە دایبنێیت

بۆ نمونە :

C:\ProgramData\Oracle\Java\javapath;%SystemRoot%\system32;%SystemRoot%;%SystemRoot%\System32\Wbem;%SYSTEMROOT%\System32\WindowsPowerShell\v1.0\;c:\Program Files\Microsoft SQL Server\100\Tools\Binn\;c:\Program Files\Microsoft SQL Server\100\DTS\Binn\;C:\Program Files\QuickTime\QTSystem\ **; C:\Program Files\Java\jdk1.8.0_131\bin ; C:\Program Files\Java\jre1.8.0_131\bin**

دواتر بە هەمان شێوە لینکی فۆڵدەرەی تریش کۆپی دەکەیت و لەتەنیشت ئەمەوە ; واتە دەبێت semicolon دابنێیت و لینکی ئەویش دادەنێیت




ئەگەر سەیر بکەیت دەبینیت هەردو لینکەکە لەدوای لینکەکەوە دانراون

پاشان دەچینەوە ناو درایفی :C و دەچینە ناو فۆڵدەری program file و دواتر دەچینە ناو فۆڵدەری java و فۆڵدەری یەکەم دەکەینەوە




لینکەکەی کۆپی دەکەین و لێرە دایدەنێین




ئەم بەشە چۆن دەکرێتەوە :
کلیك لە new دەکەین و ناوێکی دەنێین Home_java وەکو لەسەرەوە باسمان کرد لینکەکەی تێدا دادەنێین

ئێستا کارەکەمان تەواوکرد ئێستا دەچین cmd دەکەینەوە بزانین ناسێنراوە و کێشەی نیە

دوای ئەوەی cmdکرایەوە دەنوسین javac و Enterدەکەین

Command Prompt

```
Microsoft Windows [Version 10.0.10240]
(c) 2015 Microsoft Corporation. All rights reserved.

C:\Users\Sima>javac
Usage: javac <options> <source files>
where possible options include:
  -g                         Generate all debugging info
  -g:none                    Generate no debugging info
  -g:{lines,vars,source}     Generate only some debugging info
  -nowarn                    Generate no warnings
  -verbose                   Output messages about what the compiler is doing
  -deprecation               Output source locations where deprecated APIs are used
  -classpath <path>          Specify where to find user class files and annotation
  -cp <path>                 Specify where to find user class files and annotation
  -sourcepath <path>         Specify where to find input source files
  -bootclasspath <path>      Override location of bootstrap class files
  -extdirs <dirs>            Override location of installed extensions
  -endorseddirs <dirs>       Override location of endorsed standards path
  -proc:{none,only}          Control whether annotation processing and/or compilati
  -processor <class1>[,<class2>,<class3>...] Names of the annotation processors to
ss
  -processorpath <path>      Specify where to find annotation processors
  -parameters                Generate metadata for reflection on method parameters
  -d <directory>             Specify where to place generated class files
  -s <directory>             Specify where to place generated source files
  -h <directory>             Specify where to place generated native header files
  -implicit:{none,class}     Specify whether or not to generate class files for imp
  -encoding <encoding>       Specify character encoding used by source files
  -source <release>          Provide source compatibility with specified release
  -target <release>          Generate class files for specific VM version
```

دەبینین کێشەی نیە دەبێت لای تۆش بەم شێوەیە بێت ئەوکات جافا ناسێنراوەو بەرنامەی ئەندرۆید بکەرەوە و کارەکانت بکە

ئەگەر کێشەی هەبو دوبارەی بکەرەوە هەنگاوەکان بەباشی جێبەجێبکە بۆ ئەوەی کێشەکانت نەمێنێ

# دابەزاندنی بەرنامەی ئەندرۆید ستۆدیۆ

**دەچینە ناو سایتی ئەندرۆید ستۆدیۆ**

https://developer.android.com/studio/index.html

یان لە سایتی گۆگڵدا بنوسە Android Studio و دایبەزێنە:




**هەناگاوەکان جێبەجێبکە تا کۆتایی دادەبەزێت**



## دوای دابەزاندن :

## چۆنیەتی کردنەوەی بەرنامەکە و پرۆژەی نوێ

# SDK Manager

پێش ئەوەی پرۆژەی نوێ دروست بکەیت دەبێت SDK داببەزێنیت بۆ ئەم مەبەستە

بۆ دابەزاندنی ئەم بەشە دەبێت هێڵی ئینتەرنێتت هەبێت

کلیك لە Configureدەکەین



پاشان كليك لە SDK Manager دەكەين




خشتەيەكمان بۆ دەكرێتەوە لە Android SDK و لەبەشی سەرەوە SDK Platform هەڵدەبژێرين و نيشانەی راست لەو دووانە دەدەين ئەمەش دياريكردنی ڤێرژنی ئەندرۆيدە دەتوانی هەموی دابەزێنيت و ئاساييە



پاشان كليك لە بەشی SDK Tools دەكەين و نيشانەی ڕاست لەو هەڵبژاردانە دەدەين كە لە وێنەكەدا ديارە




هەندێجار بەپێی ئيشی خۆت هەندێكيت پێويست نيە يان ئەوانی ترت پێويست دەبێت دەتوانيت دايببەزێنيت

# دروستکردنی پرۆژەی نوێ

دوای ئەوەی بەرنامەکەمان کردەوە کلیك لە :




دواتر ناوی پرۆژەکە دەنوسین

وە شوێنی خەزنی پرۆژەکەش دەتوانین دیاری بکەین



پاشان بەرنامەکە بۆ چی ئامێرێك دروست دەکەیت دیاریدەکەیت
ئێمە بۆ ئایفۆن و تابلێت بەرنامەکە دروست دەکەین

Phone and Tablet

Minimum SDK: API 15: Android 4.0.3 (IceCreamSandwich)

Lower API levels target more devices, but have fewer features a
targeting API 15 and later, your app will run on approximately
devices that are active on the Google Play Store. Help me choo

TV (Not Installed)

Minimum SDK

Wear

Minimum SDK: API 20: Android 4.4 (KitKat Wear)

Glass

Minimum SDK: Glass Development Kit Preview (Google Inc.) (API 19)




پاشان شێوازێك لە
روخساری بەرنامەکە بۆ
ئیشکردن هەڵدەبژێرین

## دواتر ناوی روکار و ناوی کۆدەکە دەنێین

واتە ئەم بەرنامەی تۆ دروستی دەکەیت دوو بەشە

یەکەم : روکاری بەرنامەکە واتە روکاری وێنە و دەرکەوتەیە بەکارهێنەر دەیبینێت

دووەم : کۆدەکەیە کە تەنها بەرهەمێنەر دەیبینێت

لێرەدا هەردو بەشەکە ناو دەنێین




پاشان Finish دەکەین و چاوەرێ دەکەین تا پرۆژەکە دەردەکەوێت و ئیشەکانی تێدا دەکەین

# ئەمەش پرۆژەکە لەبەرنامەی ئەندرۆید ستۆدیۆ



ئەم بەشە
بریتیە
لە کۆدی
بەرنامەکە
و
روکاری
بەرنامەکە
کارەکانمانی
تێدا ئەنجام
دەدەین

# Design



ئەم بەشە بریتیە لە بابەتەکان بۆ دیزاین و دروستکردنی روکاری بەرنامەکە بۆ نمونە نوسین و وێنەو دوگمەو خشتە ... هتد

# دروستکردنی ئامێری خەیاڵی ( مۆبایلی خەیاڵی)
# Android Emulators

کاتێك بەرنامەیەك دروست دەکەین دەبێت مۆبایلێك هەبێت بۆ ئەوەی ئەنجامەکەی ببینینەوە و ڕەن بێت لەسەری
بۆ ئەمەش دەبێت مۆبایلی خۆت بەکاربێنیت یان مۆبایلێکی هاوشێوەی ئەوەی خۆت بەلاْم خەیاڵی لەناو بەرنامەی ئەندرۆید دروست بکەیت
واتە هەموکات تۆ مۆبایلی خۆت لەبەردەست نیە و بیبەستیت بە کۆمپیوتەرەکەتەوە بۆ ئەوەی ئەو بەرنامەیەی دروستت کردووە ڕەنی بکەیت لەسەر ئەنجامەکەی بزانیت چییە بۆیە ئێمە ئێستا مۆبایلێکی خەیاڵی دروست دەکەین

دوای کردنەوەی پرۆژەکەت دەچیتە سەر
Tools > Android > AVD Manager
یان بەشی سەرەوەی بەرنامەکە دەبینیت ئایکۆنێك هەیە تایبەت بەوکارە و ناوی AVD Manager
کلیکی لەسەر دەکەیت دواتر خشتەیەکت بۆ دەکرێتەوە :







| Type | Name | Resolution | API | Target | CPU/ABI | Size |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | Android Wear Square API 21 | 280 × 280: hdpi | 21 | Android 5.0 (Android Wear) | x86 | 1 |
| | Nexus 5 API 22 | 1080 × 1920: xxhdpi | 22 | Android 5.1 (Google APIs) | x86 | 1 |
| | Android TV (1080p) API 23 | 1920 × 1080: xhdpi | 23 | Android 6.0 (Android TV) | x86 | 1 |
| | Nexus 5X API 23 | 1080 × 1920: 420dpi | 23 | Android 6.0 (Google APIs) | x86 | 1 |
| | Nexus 9 API 23 | 2048 × 1536: xhdpi | 23 | Android 6.0 (Google APIs) | x86 | 1 |

کلیك لەم ئایکۆنە بکە

Virtual Device Configuration

Select Hardware
Android Studio

Choose a device definition

| Category | Name | Size | Resolution | Density |
|---|---|---|---|---|
| TV | Nexus S | 4.0" | 480x800 | hdpi |
| Wear | Nexus One | 3.7" | 480x800 | hdpi |
| Phone | Nexus 6P | 5.7" | 1440x2560 | 560dpi |
| Tablet | Nexus 6 | 5.96" | 1440x2560 | 560dpi |
| | Nexus 5X | 5.2" | 1080x1920 | 420dpi |
| | Nexus 5 | 4.95" | 1080x1920 | xxhdpi |
| | Nexus 4 | 4.7" | 768x1280 | xhdpi |
| | Galaxy Nexus | 4.65" | 720x1280 | xhdpi |
| | 5.4" FWVGA | 5.4" | 480x854 | mdpi |

New Hardware Profile · Import Hardware Profiles

Nexus 5X
1080px · 5.2" · 1920px
Size: large
Ratio: long
Density: 420dpi

Clone Device...

Cancel · Previous · Next · Finish

لەم بەشەدا جۆری ئامێرەکە هەڵدەبژێریت ئێمە مۆبایل هەڵدەبژێرین پاشان چ جۆرە مۆبایلێك دیاری دەکەیت بە ئارەزووی خۆت دیاری بکە وە دەتوانیت خۆت مۆبایلێك دروست بکەیت ئەویش بە کلیك کردن لەسەر ئایکۆنی new hardware profile ئەمەش لەبەشی خوارەوەی خشتەکە هەیە و دواتر خشتەیەکی تر دەکرێتەوە :



پاشان Next دەکەین دەچینە هەنگاوێکی تر و خشتەیەکی تر دەکرێتەوە :




لێرەدا API هەڵدەبژێرین ئەگەر ویندۆکەت یسم بت بوو ئەوا یسم هەڵبژێرە ئەگەر [illegible] بت بوو ئەوا [illegible] هەڵبژێرە




لەم بەشەدا دەستکاری کۆمەڵێك تایبەتمەندی ترە دەستکاری دەکەیت وەکو شێوازی دەرکەوتن و دیقە و ئەوشتانەی تر کە تێیدایە

لەکۆتایدا Finish دەکەین و چاوەڕێ دەکەیت هەتا مۆبایلە خەیاڵیەکەمان بۆ دروست دەکات
ئێستا دەبێت بزانین کاتێك بەرنامەیەك دروست دەکەین چۆن ڕەن بێت




دەچینە سەر Runو کلیك لە Run app دەکەین

یان کلیك لە ئایکۆنی runدەکەین لە بەشی سەرەوەی بەرنامەی ئەندرۆید







دواتر ئەنجامی بەرنامەکە ڕەن دەبێت لەسەر ئەم مۆبایلە کە دروستمان کردووە

# HAXM installation error

## ئەم هەڵەیە چییە و چۆن چاك دەكرێت ؟

ئەم هەڵەیە كاتێك روودەدات كە دەتەوێت ئامێرەكە خەیاڵیەكە (Emulators) رەن بكەیت ئەم هەڵەیە لە شێوەی مەسج بۆكسێدا دەردەكەوێت و دەبێت ئەم هەڵەیە چارەسەر بكەیت




چارەسەركردنی ئەمەش ئاسانە لەبەشی SDK Manger بەشێك هەیە دانەبەزیووە پێویستە بچین دایبەزێنین بۆ ئەوەی ئەم هەڵەیەمان نەمێنیت، دەچینە سەر

Tools > Android > SDK Manager

بەشی SDK دەكرێتەوە و پاشان لەبەشی SDK Tools ئەم بەشە نیشانی راستی لێ دەدەین و Apply دەكەین



# Enable Virtualization Technology VTx

## ئەم هەڵەیە چییە و چۆن چاك دەكرێت ؟

ئەم هەڵەیەش وەكو هەڵەكەی پێشوو كاتێك روودەدات كە دەتەوێت ئامێرەكە خەیاڵیەكە (Emulators) رەن بكەیت لە شێوەی مەسج بۆكسێدا دەردەكەوێت



Troubleshoot

Intel HAXM is required to run this AVD.
/dev/kvm is not found.

Enable VT-x in your BIOS security settings, ensure that your Linux distro has working KVM module.

OK Cancel

چارەسەری ئەم هەڵەیە لە BIOS دا دەكرێتەوە، كۆمپیوتەرەكەت Restartدەكەیتەوە و دەچیتە ناو Bios لەوێدا بەشی Virtualization Technology هەیە و Disable كراوە تۆ دەبێت Enableی بكەیت پاشان سەیڤی بكەو بچۆرەوە ناو ویندۆ و بچۆرەوە ناو بەرنامەی ئەندرۆیدەكە كاری خۆت بكە




كۆمپیوتەرەكان بایۆسیان جیاوازە هەریەكەیان بە جۆرێكە ئاگاداربە بەلاَم گرنگ ئەوەیە تۆ ئەو بەشە بدۆزیتەوە لەناو بایسۆدا

# پێکهاتەی بەرنامەی ئەندرۆید

ئەندرۆید لەچەند بەشێك پێکهاتووە ئێمە ئێستا باسی بەشی تەنیشت دەکەین

ئەم بەشە هەمو کۆدو وێنەو نوسین و بابەتەکانی ئەو بەرنامەیە لەخۆ دەگرێت کە تۆ دروست دەکەیت

وەکو دەزانین بەرنامەیەك کە دروستی دەکەین لە دوو بەش پێك دێت:

ئ- روکاری بەرنامەکە ( وێنە – نوسین – خشتە – ئایکۆن و چەندین بابەت کەلەسەر روکاری دەرەوەی بەرنامەکە هەیە)

واتە ئەو روکارەی کە بەکارهێنەرەکە دەیبینێت و دیارە

ب- ئەو بەشەی کە بەکارهێنەرە نایبینێت و دیارنیە ئەویش کۆدەکانە ( کۆدی جاڤا ) هەمو کارو چالاکیەکان ئەم کۆدانە دەیکەن، تەنها ئەو کەسە دەیبینێت کە دروستی دەکات

دواتر کە بەرنامەکە دروستکراو خرایە بەردەست بەکارهێنەر ئەم کۆدانە لە پشتەوە کاری خۆیان دەکەن و بەکارهێنەر ناتوانێت بیانبینێت

واتە ئەندرۆید بەشێکی هەیە لە شێوەی فۆڵدەر بۆ هەڵگرتنی ئەم وێنەو نوسین و کۆدانە

هیچ شتێك لەو شتانەی لەسەرەوە باسمان کرد تێکەڵی ئەویتر نابێت هەر بابەتەو دەچێتە ناو فۆڵدەری تایبەتی خۆیەوە

دەبێت بەرهەمهێن ئەم بەشە بناسێت و بزانێت کاری تێدابکات، بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی بەرنامە دروست بکات

# پێکهاتەی بەرنامەی ئەندرۆید







یەکەمجار دەبێت Android هەڵبژێرین

دواتر فۆڵدەرەکانمان بۆ دەکرێتەوە




ئەم بەشە لە دوو بەش پێك دێت :

یەكەم : app

دووەم : Cradle Scripts

بە كلیك كردن لەسەر ئەو سەهمانەی تەنیشتیان ئەم دوو بەشە دەكرێنەوە هەریەكێك لەمانە یەك كۆمەڵ فۆڵدەری تری تێدایە كە هەر فۆڵدەرەو بۆ بابەتێكی دیاریكراو ئامادەكراوە

Appیەكەم : پێكهاتووە لە سێ بەشی گرنگ ئێستا باسی ئەم بەشە دەكەین:

أ – Manifestsتایبەتە بە ناساندنی هەر كلاس و روكارێك كە زیادی بدەین بۆ بەرنامە لێرەدا دەیناسێنین

ب– Java ئەم بەشە تایبەتە بە هەڵگرتنی كۆد و كلاسەكانی جافا

ج– res ئەم فۆڵدەرە تایبەتە بە هەڵگرتنی وێنەو نوسین و ڤیدیۆ و بازنەو هێڵ و خشتە و ... بابەتی تر كە لەروخساری بەرنامەكەدا هەیە




**ئەگەر سەیربکەیت دەبینیت فۆڵدەرەکان کراونەتەوە و فایلی تایبەتی تێدایە**

**هەر فۆڵدەرێك یەك دانە فایلی تێدایە بەپێی پێویست و ئیشەکانی خۆمان هەریەك لەو بەشانە فایلی تری بۆ زیاد دەکرێت، ئەگەر فایلێکمان زیاد کرد بۆ ئەو بەشانە ئەوا لە بەشی** manifests **دا دەیناسێنین**

**بۆ نمونە ئەگەر پێویستی کرد تۆ دوو روکار یان زیاترت زیاد دەکەیت بۆ بەرنامەکە یان کلاسێکی ترت زیاد دەکەیت بۆ جاڤاکە واتە بەپێی ئیشی خۆت زیاد و کەم دەکەیت**

# پێکهاتەی بەرنامە (App)







روکاری دەرە کە دیارە پێی دەڵێن lay out کە لەناو فۆڵدەری res دا هەیە

کۆدەکانی پشتی ئەم lay out کە نابینرێت بریتیە لە کۆدی java کە لەناو فۆڵدەری java دا هەیە

بەرهەردوکیان Activity دروست دەکەن

# Activity

کاتێك كه پرۆژه دروست دەكەین تەنها یەك Activity مان هەیە
بەڵام ئەگەر پێویستمان بوو دەتوانین دروست بكەین



# Activity

پێشتر باسمانکرد کە ئەو بەرنامەیەی دروستی دەکەین پێکهاتووە لە کۆد و روکار، دەبێت ئەو کۆدو روکارە پێکەوە ببەستین واتە هەمو دوگمەو وێنەو بابەتەکانی سەر روکارەکە ببەستین بە کۆدی جافاکەوە




ئەم پێکەوە بەستنەش لەرێگەی میسۆدێکەوە دەبێت :

```
public void onCreate(Bundle savedInstanceState){
super.onCreate(savedInstanceState);
setContentView(R.layout.activity_main);
}
```

ئەم میسۆدەش پێکهاتووە لەم شێوەیە بۆ پێکەوەبەستنی ئەو دوو بەشە



## نێتۆرک
## Network

» جۆرو شێوازەکانی نێتۆرک
» جۆرەکانی وایەر (Wire)
» پرۆتۆکۆلەکان (Protocol)

» دانانی IP بۆ کۆمپیوتەر
» پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەر
» Share Printer _ Share Folder

» راوتەر وایەرلس چیە؟
» داخستن و بلۆککردنی سایت
» فلتەرکردنی ماک ئەدرەس

» Cisco چییە؟
» دانانی ناوو پاسۆرد بۆ سویچ
» چۆنیەتی Telnet کردن

CISCO
CCNA

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف

سێرڤەر، دروستکردنی USER | بەرنامەی NetSupport

## چۆنیەتی نوسینی سی ڤی CV

چۆن دەبیتە خاوەنی باشترین سی ڤی

بۆ دەستکەوتنی هەلی کار

» - هەنگاوەکانی نوسینی سی ڤی
- سیفاتەکانی سی ڤی سەرکەوتوو
- نمونەیەک لە سی ڤی
- پێکهاتەی سی ڤی
- جۆرەکانی سی ڤی
- دیزاینکردنی سی ڤی

» - چاوپێکەوتن
- خۆ ئامادەکردن بۆ چاوپێکەوتن
- کاتی چاوپێکەوتن
- خۆت ئامادەبکە بۆ ئەم پرسیارانە

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف

CURRICULUM VITAE

## کۆمپیوتەر گراف
## Computer Graphics
### GUI in Matlab

+ دروستکردنی Line
+ دروستکردنی Circle
+ دروستکردنی Polygon
+ دروستکردنی Helix
+ دروستکردنی Ellipse
+ Image Transformation
+ 2D Transformation

MATLAB

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف

زانکۆی سلێمانی 2016

پێشکەشە بە فێرخوازان
م.محمد m.kazm81@gmail.com

## ئۆراکڵ - SQL
## ORACLE Database

SQL

+ دابەزاندنی ئۆراکڵ
+ فێرکاری ئۆراکڵ
+ دروستکردنی خشتە
+ دروستکردنی User
+ کۆدەکانی SQL

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف

زانکۆی سلێمانی 2016

پێشکەشە بە فێرخوازان
م.محمد m.kazm81@gmail.com

## ماتلاب
## MATLAB

MATLAB®

پێشکەشە بە فێرخوازان

+ دروستکردنی ماتریکس
+ کردارە بیرکارییەکانی ماتریکس
+ Numerical _ Function
+ Plot _ Bar _ Surf

وانەی ماتلاب، وانەیەک بۆ فێرخوازانی قۆناغی زانکۆ، پەیمانگا، ئامادەیی، پیشەیی و قوتابخانەکانە، فێرخوازان دەتوانن سودی لێوەربگرن

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف

m.kazm81@gmail.com
زانکۆی سلێمانی 2016

## ئەندرۆید ستۆدیۆ
## Android Studio

- دابەزاندنی Java
- ناساندنی Java و چاککردنی هەڵەکان
- دابەزاندنی بەرنامەی ئەندرۆید ستۆدیۆ
- دابەزاندنی SDK Manager
- دروستکردنی ئامێری خەیاڵی (Android Emulators)
- چارەسەری هەڵەی HAXM installation error
- چارەسەری هەڵەی
Enable Virtualization Technology VTx
- پێکهاتەی بەرنامەی ئەندرۆید
- پێکهاتەی APP.
- Activity چییە ؟

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف